به ناوی خودای گەورە و میهرەبان



پوختەیەک لە هەندێک دەرمانی ئافرەتان ( النسائية )
و چارەسەری هۆڕمۆناتی ئافرەتان و پیاوان

ئەم کۆمەڵە دەرمانە کە لە شێوەی pdf دانراوە یارمەتی دەرە
بۆ ئەو خوێندکارانەی کە لە دەرمانخانەکان کاردەکەن
و سەرەتایانە هیوادارم سوودمەند بن



زانینی ئەم دەرمانانە و چۆنێتی بەکارهێنانی واتایی ئەوە نییە
بەبێ راچێتەی دکتۆر بدرێت بەڵکو ئەمە تەنها گەیاندنی زانیاریەکانە

دیزاین و ڕێکخستنی
*Yassin H. Latif*
لێرەوە سوپاس و پێزانین بۆ ئەو بەڕێزەی
کە ئەم کومەڵە زانیاریە بەخشیوە
*SaFeen W. Hamadameen*



# Common gynaecology drugs and conditions

زۆربوونی ئیسترۆجین

له ئافرەتدا دەبێتە هۆی ئەستوربوونی مەمک و هەستکردن بە ئازار لەکاتی دەسلێدانی، ناڕێکی سوڕی مانگانە، زیادبوونی کێش، خەوزڕان، هەستکردن بە ماندوویی و بێتاقەتی.

هۆی کەمی ئیسترۆجین

له لەشی ئافرەتدا چیە و دەبێتە هۆی چی؟

/وەڵام

هۆیەکەی بوونی کێشە لە هێلکەدان، سوری مانگانە، نەشتەرگەری هێلکەدان

دەبێتە هۆی وشکبوونەوەی

(پیست-چاو-زێ Vagina )

دابەزینی کالسیۆم کە ئەمەش دەبێتە هۆی پوکانەوەی ئێسک،

توشبوون بە هەوکردن لە منداڵدان و ملی منداڵدان واتة (Uterus_Vagina)

-قژ هەڵوەرین و دەرکەوتنی زیپکەو ناڕێکی سوڕی مانگانە و نەزۆکی.



## *Common gynaecology drugs and conditions*

:( Progestrone ) پڕۆجیسترۆن

لە لایەن هێلکەدان دەردەدرێت بەڵام سەرەکی نیە وەک ئیسترۆجین
ئەوەش بەرپرسە لە ڕێکخستنی سوڕی مانگانە
وزیادکردنی ئەستوری ناوپۆشی منداڵدان.

ئافرەتاندا زۆربوونی پڕۆجیسترۆن لە لەش دەبێتە هۆی
دەرکەوتنی کیس لەسەر هێلکەدان و ماندویی.

کەمی پڕوجیسترۆن لە لەشی ئافرەتدا دەبێتە هۆی
، نەزۆکی، نارێکی سوری مانگانە
خەمۆکی، قلقی، سەرئێشە.
لە دووگیاندا دەبێتە هۆی زیادبوونی کێش و
هەندێک جار لەبارچونی منداڵەکە.



## Common gynaecology drugs and conditions

هۆڕمۆن: ماددەی کیمیایین لە لایەن ڕێژێنەکانی لەش دەردەدرێن
بۆ کۆنترۆڵ کردنی فرمانەکانی لەش وەک
( زۆربوون و گەشە و هەستکردن بە ماندویی و برسیبوون ...... ).

لە ئافرەتدا ( Ovary ) هێلکەدان
بەرپرسە لە دەردانی هۆڕمۆنی
( testosterone ، progesterone ، Estrogen )
هەروەها ئەدرینالینە ڕژێنیش بەرپرسە لە کۆنترۆڵکردنی
هۆڕمۆناتی جنسی و کۆرتیزۆن.

ئیسترۆجین ( Estrogen ):
لەلایەن هێلکەدان دەردەدرێ بەرپرسە لە زۆربوون و گەشە
ڕێکخستنی سوڕی مانگانە، هەروەها ئامادەکردنی لەش
و منداڵدان بۆ دووگیان بوون.



## *Common gynaecology drugs and conditions*

تێستۆستیرۆن ( Testosterone ):

هۆرمۆنێکە لە پیاواندا هەیە ڕۆڵی هەیە لە گەشەی ئەندامەکانی لەشی پیاوان هەروەها دەرکەوتنی نیشانە دووەمیەکانی وەک دەرکەوتنی مووی ڕوخسار

زۆربووني تێستۆستیرۆن لە لەش دەبێتە هۆی چی؟

لە لەشی پیاودا دەبێتە نەزۆکی، گەورەبوونی ئەندامەکانی لەش، هەروەها گەر زیاد لە بڕی پێویست بێ دەگۆڕێت بۆ **Dihydrotestosterone**

دیهایدرۆ تێستۆ ستیرۆن **Dihydrotestosterone**

ئەندرۆجینی بەهێزە لە پیاواندا دەبێتە هۆی گەورەبوونی پرۆستات وقژهەڵوەرین. هەروەها هۆی بەشێکی قژهەڵوەرین دەگەڕێتەوە بۆ تێستۆستیرۆن.

لە لەشی ئافرەتدا دەبێتە هۆی :

دەرکەوتنی زیپکە و موی زیادە لە لەش و دەم و چاو.

ناڕێکی سوڕی مانگانە.

دروستبونی کیس لەسەر هێلکەدان

گۆرانی دەنگ و دەرکەوتنی زیپکە و

هەڵوەرینی بەشی بێشەوەی سەر (نێوچەوان).



## *Common gynaecology drugs and conditions*

کەمبونەوەی تیستۆستیرۆن لە پیاواندا دەبێتە هۆی چی؟
.کەمبوونی ئارەزووی سێکس
کەمبونەوەی دروستبوونی سپێرم (نەزۆکی)
کەمبونی گەشەی ماسولکەی لەش و داخورانی ئێسک
لەپیاو و ئافرەتیشدا.
.ئەستوربوونی مەمک



## Common gynaecology drugs and conditions

# Estrogen drug

## -Estradiol(Estrofem)-Ethinyl estradiol

بۆ ئەو کەسانە بەکاردێ کە ئیسترۆجینیان کەمە
وە بۆ بەهێزکردنی هێلکەدان ، بۆرێکخستنی سوڕی مانگانە،
بۆ کیسی هێلکەدان، بۆ داخوراني ئێسک

:کاریگەري لاوەکی
کۆبوونەوەی ئاو لە پێیەکان( edema)
شێرپەنجەی ( ڕەحم و مەمک) ،بەرزکردنەوەی زەخت.

/تێبینی
زیاتر ئەوکەسانەی تەمەنیان سەروو 45 ساڵە ئیسترۆجین وەردەگرن
ئەمەش بەهۆی نەمانی سوڕی مانگانە توشی داخورانی ئێسک
و کێشەی کەمی ئیسترۆجین دەبن.
نیشانەکانی نەمانی سوڕی مانگانە
لەرز و تا، ئازاری چۆک بەهۆی کەمی کالسیۆم دروستبونی کێشە لە ڕەحم
ئەوکەسانەی دەرمانی ئیسترۆجین بەکاردێنن
نابی زەخت و شەکرەی هەبێ






# Common gynaecology drugs and conditions

## Estrogen drug

### ( Clomid ) - clomifene

بەکاردێت بۆ بەهێزکردنی هێلکەدانی ئافرەت ، هەروەها
هانی دەردان و گەشی هۆڕمۆن دەدات بەتایبەت هۆڕمۆنی
**FSH ( follicle stimulating hormone)**
**LH (luteinizing hormone)**
کە ڕۆڵی گرینگیان هەیە لە پێگەیاندنی هێلکەی ئافرەت
**Ovulation.**

لە پیاودا،
**FSH**
هانی زیادکردن و بەرهەمهێنانی سپێرم دەدات وە
**LH**
هانی زیادکردن و بەرهەم هێنانی تێستۆستیرۆن دەدات.

تێبینی/
کلۆمید:Clomid:
بۆ دووگیان نابێت چونکە زیان بە کۆرپەلە دەگەیەنێت
و بۆ شیردەریش نابێت چونکە بەرهەمهینانی
شیر کەم دەکاتەوە.






## *Common gynaecology drugs and conditions*

# *Antiestrogen drug*

### *Receptor antagonist ( Tamoxifene , Raloxifene )*







### *Other agonist : ( Danazol )*




### *Aromatase inhibitor : (Letrozole, Anastrozole ,Exemestane )*












# Common gynaecology drugs and conditions

## Antiestrogen drugs

**( Tamoxifen ، Raloxifene )**

بەکاردێن بۆ شێرپەنجەی مەمک:

**Breast cancer**

بەکاردێ لە پیاو و ئافرەتان، بۆ داخورانی ئێسک هەروەها بۆ گەورەکردنی ماسولکە لەلایەن یاریزانانی لەش جوانی.

کاریگەری لاوەکی

**Tamoxifen:**

تێکچونی فسیۆلۆجی لەش، گەورەکردنی هێلکەدان ، سەرئێشە، ماندویی ، هێلنج ،قەبزی ،کەمبونی حەزی جنسی.









## Common gynaecology drugs and conditions

# Antiestrogen drugs

## Danazol

بەکاردێ بۆ لاوازی ڕەحم و لاوازی مەمک واتە هەبوونی کیس
لە سنگ و مەمک
( *fibrocystic breast disease* ) .
هەروەها بۆ ئەوانەش بەکاردێ کە شانەکانی ناو ڕەحمیان
لەدەرەوەی ڕەحم گەشە دەکات
( *endometriosis* )
بۆ خوێنبەربوون.

/تێبینی
بۆ دووگیان و شیردەر نابێ هەروەها ئەوانەی نەخۆشی جگەر و گورچیلەیان هەیە نابی بەکاری بێنن.






## Common gynaecology drugs and conditions

### Antiestrogen drugs

### ( Letrozole , Anastrozole, Exemestane ):

بەکاردین بۆ گرێ و خانە شێرپەنجەی سینگ و مەمک ***breast tumor***
، وە بۆ نەزۆکیش ئەمەش لەرێگەی ***Ovulation induction***
بۆ کیسی هێلکەدانیش بەکاردێ، وە بەکاردێ بۆچارەسەری حاڵەتی ***gynecomastia***
لەپیاوان ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی ئەستوربون و گەورەبوونی شانەکانی سینگ ،
وە بۆ زیادکردن و بەهێزکردنی سپێرمی پیاو بەکاردێ.




/تێبینی
ئەنزیمي ***Aromatase***
بەرپرسە لە بەرهەمهێنانی ئیستڕۆجین بەمەش ***Letrozole***
ئەو ئەنزیمە بلۆک دەکات بۆ چارەسەرکردنی
ئەو خانە شێرپەنجەی کە بەهۆی ***Estrogen*** دروستبووە.




**Anastrozole** ئەم دەرمانە
زۆر بەکاردێت لە لایەن یاریزانانی لەش جوانی
بۆ ڕێکخست و دروستکردنی ماسولکە.






# Common gynaecology drugs and conditions

## Progesterone drug

*1- hydroxyprogesterone ( Primolut Depot)*
*2- progesterone(Cyclogest)*
*3- Norgestrel (ovral)*
*4- Levonorgestrel(I pill , Navela)*
*5- Norethisterone (primolut-N)*
*6- Desogestrel (cerazette)*
*7- Dydrogesterone (Duphaston)*
*8- Gestodene*
*9- Drospirenone*
*10- Medroxyprogesterone ( provera).*
*11-Dienogest ( Visanne )*




































# Common gynaecology drugs and conditions

## Progesterone drug

### Other combined oral contraceptive:

- ***Levonorgestrel+ethinyl estradiol(Microgenon, Femexin ,Ovocept)***
- ***Norgestrel+estradiol ( Progyluton )***
- ***Degestrel+ethinyl estradiol (Marvilon, Ciclomex )***
- ***Gestodene + ethinyl estradiol (sanya, katya)***
- ***Estradiol + Norethisterone (Trisequens)***
- ***Cyproterone+ ethinyl estradiol (Diane , Dianetite, Clairette) .***
- ***Drospirenon+ethinyl estradiol (Yasmin,Zahra, Diva, Warda, Allegria)***





































## Common gynaecology drugs and conditions

### Progesterone drug

### هەندێک لە بەکارهێنانەکانی ئەم گروپە دەرمانە

1- بەکاردێن بۆ دواخستنی سوڕی مانگانە و ریکخستنی سوڕی مانگانە (تنظیم) یان پێشخستنی سوڕی مانگانە،

2 - بۆ ڕێگری کردن لە دووگیان بوون( منع حمل)،

3- بۆ سکپڕی لەناکاو ( Emergency contraception ) ،

4- بۆ لابردنی مووی زیادەی لەش کە بەهۆی تێکچوونی هاوسەنگی هۆڕمۆنات ،

5- بۆ جێگیر کردنی منداڵدان( تثبیت حمل ) لەڕێگەی بەهێزکردن و توندکردنی ناوپۆشی منداڵدان

6- بۆ دابەزاندای کێش، نەزۆکی ،

7- بۆ خوێنبەربوونی نائاسایی (Abnormal bleeding ).

8- بە بڕی زور بۆ چارەسەرکردنی شێرپەنجەی ڕەحم .

### کاریگەری لاوەکی ئەم گروپە دەرمانە

( قەلەقی ، قەلەوی ، ژانەسەر ، ئازاری سینگ ، هێڵنج و ڕشانەوە ، دڵەکزێ ، قەبزی ، سکچوون ، ئازاری جوومگە، تێکچوونی خەو .... )



# Common gynaecology drugs and conditions

## Progesterone drug

### تێبینی :

دەتوانین دەرمانی
**Progestrone**
بەتەنیا بۆ ڕێگری کردن لە سکپڕی منع بەکاربێنین
بەڵام Estrogen نابێ
واتە مەرجە بە ( تێکەڵە بێت combination )بێت
ئینجا بۆ ڕێگری کردن لە سکپڕی منع بەکاردێ.

**Cyproterone(androcure)**




بۆ پرچمویی ناسروشتی بەکاردێت
2mg،
هەروەها
10mg
بۆ چارەسەرکردنی هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن و منع بەکاردێ
چونکە ئەو مادده دژە ئەندروجینە و لەهەمان کاتدا سیفاتی
پرۆجسترۆنی هەیە، قوەتی 50mgیش بەکاردێ.



# Common gynaecology drugs and conditions

## Antiprogestron drug

***Misoprostol (cytotec)***
***Mifepristone .***







بەکاردێ بۆ کرداری **Abortion**
منداڵ
هەروەها بۆ بەهێزکردنی ناوپۆشی گەدە و بۆ برینی گەدەش بەکاردێت،
بۆ فڕێدانی پارچەی کۆرپەلە کە لەمنداڵدان مابێتەوە دوای لەبارچوونی منداڵ،
بۆ دروستکردنی ژانی دەستکرد لەکاتی مندالبوون

## تێبینی :

بەهیچ شێوەیەک بەبێ ڕاچێتەی دکتۆری ئافرەتان نادریتە نەخۆش



# Common gynaecology drugs and conditions

## Antiprogestron drug

**تێبینی :** چۆنیەتی بەکارهێنانیٚ دەرمانی پرۆجسترۆن بۆ دژی دووگیان بوون و ڕێکخستنی سوڕی مانگانە ( منع و تنظيم دورة الشهرية).

بۆ ڕێکخستنی سوڕی مانگانە

( ®Zahra_Warda_Yasmin _Progyluton_Diane  Allegria _ Clairette )

بەکاردیێن لە پێنجەم ڕۆژی سوڕی مانگانەوە دواتر دووەم سوڕ دووبارە دەبیٚ لە پێنجەم ڕۆژەوە حەبەکە بخوات ڕۆژی یەکجار هەموو ڕۆژی لەهەمان کاتدا بیخوات.




نۆرزیستیرۆن ( Norethisterone 5mg )

ناسراو بە ® Primolut N

بۆ دواخستنی سوڕ مانگانە ،

مەرجە 3 تا 5 ڕۆژ پێش سوڕی مانگانە حەبەکە بەکاربێنی ڕۆژیٚ دووجار .دەتوانی 15 ڕۆژ تا 20 ڕۆژ سوڕەکە دوابخەی






## Common gynaecology drugs and conditions

### Antiprogestron drug

**تێبینی :** چۆنیەتی بەکارهێنانیٚ دەرمانی پڕۆجسترۆن بۆ دژی دووگیان بوون و ڕێکخستنی سوڕی مانگانە ( منع و تنظیم دورة الشهرية).

بۆ تاخیربوونی سوڕی مانگانە و بوونی ئازار و نەبوونی سوڕ دەبیٚ
Provera( Medroxyprogestrone 5mg)
وەربگرێت رۆژیٚ دووجار تا دەکەوێتە سەر سوڕی مانگانە .




››بۆ جێگیر کردنی منداڵدان ( تثبيت حمل )
دەرزی Primolut Depot
یان Duphaston حەب بەکاردێت.
ا Hydroxyprogesterone ( Primolut Depot®).
- Dydrogesterone (Duphaston®) .









## *Common gynaecology drugs and conditions*

### *Antiprogestron drug*

**تێبینی :** چۆنیەتی بەکارهێنانیٚ دەرمانی پڕۆجسترۆن بۆ دژی دووگیان بوون و ڕێکخستنی سوڕی مانگانە ( منع و تنظيم دورة الشهرية).



**ئاگاداربن ئەم دەرمانانە بن سەلامەت نین بۆ ئەم کەسانە**



ئەو کەسانەی نەخۆشی دڵیان هەیە
، زەخت ، کۆلسترۆڵ، خەمۆکی، شقیقە، نەخوشی جگەر.



ئافرەتی دووگیان و شیردەر واباشترە ( منع طبيعي) بەکاربێنن
یان ئەو حەبانەی تەنها پڕۆجیسترۆنیان تیدایە
،چونکە ئیسترۆجین کاریگەر دەبیٚ لەسەر کورپەلە و
ڕەنگە بەرهەمهینانی شیریش کەم بکاتەوە.



# Common gynaecology drugs and conditions

## Androgen drug

***Testosteron (Androgen) drug :***
***① Natural androgen from testis > ( testosterone ) , (dihydrotestosterone) (DHT)***

***From adrenal cortex > ( Dehydroepiandrosterone(DHEA) ) (androstenedion).***

***②Synthetic androgen :***
***(Testosterone undeconate), ( Methyltestosteron ), (Mestrolone (proviron®)***

***③ Other drug > Nandrolone.***












# Common gynaecology drugs and conditions

## Androgen drug




بەکارهێنان :

**DHEA**

هۆڕمۆنی دژە پیربوونە

(antiaging hormone)

لەئافرەتاندا بەکاردێ بۆ بەهێزکردنی هێلکەدان، نەزۆکی ، پێگەیاندنی هێلکە.

لەپیاواندا بۆ تاقە (منشط جنسي)بەکاردێ .

* بۆ گەشەی ئەندامەکانی پیاو

، بۆ لاوازی جنسی، ڕۆلی هەیە لە دروستکردنی سپێرم ،

زیادکردنی گەشەی ماسولکەی لەش، بۆ ڕۆماتیزم و سۆفانیش بەکاردێن.

*

،بۆ چارەسەرکردنی کەمخوینی بەهۆی نەخۆشیەکانی گورچیلە

و بۆ شێرپەنجەی تەشەنەکردوو، بۆ کەمبونەوەی سپێرم ،

زیادکردنی گەشەی ماسولکە و ڕۆماتیزم و سۆفان.

کاریگەری لاوەکی

التهابی پرۆستات، زیپکە ، زیادبوونی مووی لەش ، ئەستوربوونی سینگ و مەمک



## Common gynaecology drugs and conditions

### Antitestosteron(antiandrogen):

① Receptor antagonists : (Flutamide , bicalutamide (Casodex®) ) .
② 5-alpha reductase inhibitor: Finasteride .
③ Synthesis inhibitors : Ketoconazol .
④ Cyproterone , spironolactone.

بەکارهێنان

**( bicalutamide , flutamide )**

بەکاردێت بۆ شێرپەنجەی پڕۆستات تەشەنەکردوو ،
بۆ چارەسەری پڕ مویی ناسروشتی بەکاردێ.







**( finasteride ) ®Prostacare**

بۆ چارەسەرکردنی گەورەبوونی پڕۆستاتی (حمید)
تەشەنە نەکردوو ، بۆ ڕووتانەوەی قژی سەری پیاوان بەکاردێ.




**( Ketoconazole)**

دژە فطریاتە بەڵام وەک دژە ئەندرۆجینیش
( antiandrogen )
بەکاردێت.






# Common gynaecology drugs and conditions

## Antitestosteron(antiandrogen):

*① Receptor antagonists : (Flutamide , bicalutamide (Casodex®) ) .*
*② 5-alpha reductase inhibitor: Finasteride .*
*③ Synthesis inhibitors : Ketoconazol .*
*④ Cyproterone , spironolactone.*

بەکارهێنان

### ( Cyproterone ) ®Andrucure

بەکاردێت بۆ زیادبوونی لە رادەبەدەری ئارەزووی سێکسی لەپیاواندا،
وەک ئازارکەمکەرەوە بۆ شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات،
پرمویی ناسروشی لە ئافرەتان و زیپکەی توند.




### ( Spironolactone ) ®Aldactone

خۆی لە گروپی میزپێکەرەکانە (مدررة ) بۆ دابەزاندنی زەخت
لەهەمان کاتدا بۆ قژ هەڵوەرینیش بەکاردێ
چونکە دژە ئەندروجینیشە ( Antiandrogen ).






## Common gynaecology drugs and conditions




### methylergometrine ( Methergin ®)

، بەکاردێت بۆ ڕاگرتنی خوێن دوای لە دایکبوون منداڵ
هەروەها ڕاگرتنی خوێن دوای لەبارچوونی منداڵ .
لە ڕێگەی گرژکردن و ڕەقکردنی ماسولەکەکانی منداڵدان
وا دەکات خوێنبەربوون کەم بکاتەوە.

### isoxsuprine Hcl( Duvilane® ,Duvadilan ®)







بەکاردێت بۆ خاوکردنەوەی ماسولکەکانی منداڵدان
و لوسە ماسولەکە،
هەروەها فروانکردی ملولەکانی خوێن ،
هەروەها بەکاردێت پێش منداڵبوون .

زۆر جار لە کۆتاییەکانی هەفتەکانی دووگیانی یەکێک لەم دوو دەرزیە
کە لە گروپی ( Corticosteroid ) ن ئەنوسرێت بۆ ئافرەتی دووگیان بۆ
ڕێگری کردن لە هەناسەتەنگی بوونی کۆرپەلە.

### * Dexamethasone ampule
### * Betamethasone ampule









# Common gynaecology drugs and conditions

## Tranexamic acid ( Cyclokapron®)
## ئەم دەرمانە لە گروپی antifibrinolytic




بەکاردێت بۆ نەهێشتنی خوێن بەربوون ( نضیف )
بۆ نمونە لەکاتی سووڕی مانگانە دا .
. ڕاگرتنی خوێن بەربوون لەکاتی دەرهێنانی ددان
.لەکاتی برینداربوون دا
.بەکاردێ لەکاتی خوێنبەربوونی لووت، ناو سک، سییەکان، بۆری میز دا

## Cabergoline ( Dostinex ®)




، بەکاردێت بۆ چارەسەری هەندێک کێشەی سوڕی مانگانە
هەروەها بۆ چارەسەری ناتەواوی هۆڕمۆناتی ئافرەتان
بە تایبەت هۆڕمۆنی Prolactin
،هەروەها بۆ چارەسەری هەندێک کێشەی مەمکی ئافرەتان ،
هەروەها بۆ ڕاگرتنی شیری ئافرەتانیش بەکاردێ .

## pitocin




مادەی ئۆکسیتۆسین
بە شێوەی دەرزی بەردەستە، هەروەها
بۆ هاندانی منداڵبوون و بۆ خوێنبەربوونی
دوای منداڵبوون بەکاردێت.



## Common gynaecology drugs and conditions

## هەوکردنی ئافرەتان

.سێ جۆری بەناوبانگی هەوکردن هەیە بریتین لە:
مشەخۆر Trichomonas ،بەکتریا Bacerial، کەڕوو Fungai

### هەوکردنی کەڕووی

کاندیداز candidiasis

باوترین هەوکردنی زێیە خوران و هەوکردن لە زێ و کۆئەندامی زاوزێدا،
curde viscous white discharge

واتە خوران و سوتانو سووربوونەوە لەو شوێنەی کە دەردانی سپی تێدایە
کاندیدا candidaلە بنەڕەتدا بەشێکە لە فلۆرا ئاساییەکانی زێ
و ناوچەکانی تری لەش بەلام لە هەندێک حاڵەتدا دەبێتە
گەشەیەکی نائاسایی و دروستبوونی ئەم نیشانانە

بە سادەیی دژە کەڕووەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە،
لۆکالی لە شێوەی کرێم، شاف(تحامیل)،
یان کەپسوول هەموویان یەک کاردەکەن

*1- Econazol supp once befor bed.*
*2- Miconazol supp or cream once befor bed.*
*3-clotrimazol supp or cream once befor bed*















# Common gynaecology drugs and conditions

## هەوکردنی ئافرەتان

.سێ جۆری بەناوبانگی هەوکردن هەیە بریتین لە:
مشەخۆر Trichomonas ،بەکتریا Bacerial، کەڕوو Fungai

### هەوکردنی کەڕووی

***4- Fluconazole***
***5 sodium bicarbonate soap***

بۆ فلۆکۆنازۆڵ، ژەمە دەرمانەکەی بۆ هەوکردنی کەرووی زێ بەم شێوەیە دەبێت:




***uncomplecatid : 150mg one single dose.***
***complecatid :150mg every 3 day doses***
***recurrent :150mg daily for 10 days then once weekly for 6 .3 month***

### غسولەکان

هەوکردنی کەڕوەکان حەزیان لە ناوەندی ترشە، بۆیە غسولی بنەڕەتی بەکاردەهێنین بۆ نەهێشتنی هەوکردنەکە. باوترین و سادەترینیان بریتین لە سۆدیۆم بیکاربۆنات، جا لە شێوەی سابوون بێت یان فۆمی لۆشنی ئامادەکراو وە ph بۆ زۆربەیان ئامادەیە لێرەدا غسولی بنەڕەتی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لەسەری بمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی هەوکردنەکان دەڕۆن. بۆ نموونە هەفتەیەک، چونکە بەردەوامبوون لەسەری لەوانەیە ببێتە هۆی هەوکردنی .






# *Common gynaecology drugs and conditions*

## هەوکردنی ئافرەتان

.سێ جۆری بەناوبانگی هەوکردن هەیە بریتین لە:

مشەخۆر Trichomonas ،بەکتریا Bacerial، کەڕوو Fungai

### هەوکردنی بەکتریا

دەردانی سپی ، بۆنی ماسی هەوکردنی بەکتریا، واتە لێرەدا خورانەکە سووکترە
و هەوکردنەکە نیشانەکانی زۆر دیار نییە ، بەڵام دەردراوەکان
شلەی ڕەنگی سپین و لەوانەیە ڕەش بن

**چارەسەر**

*Metronidazol (or Tinidazol)*

*Metronidazol vag gel: daily for five day*

*Clindamycin vag gel: daily for 7 day*












# Common gynaecology drugs and conditions

## هەوکردنی ئافرەتان

.سێ جۆری بەناوبانگی هەوکردن هەیە بریتین لە:
مشەخۆر Trichomonas ،بەکتریا Bacerial، کەڕوو Fungai

**هەوکردنی مشەخۆر** مشەخۆرە. ئەم هەوکردنە توندترە و نیشانەکانی بەهێزترن

گرنگترین تایبەتمەندی ئەمە ڕەنگی دەردراوەکانە بە ڕەنگی زەرد یان سەوز
هەروەها زۆرن و شلەیەکی سووکن لەگەڵ بوونی
سووربوونەوە و هەوکردن لە ناوچەکەدا. نەخۆشی تریکۆمۆنیا بە پێچەوانەی
کەڕوو و بەکتریا ( دوای هاوسەرگیری بە شێوەیەکی بەرچاو زیاتر باو دەبن)

### چارەسەر

*metronidazol or tinidazol :2g(4tab) together as single dose Or Metronidazol 400mg twice daily for 5-7 day*










